زنجیرەی مێژوو بۆ لاوان (10)

# جەنگی سارد

ئالاسدر نیکلسن

و: ئاگری ئەفشین



2017

زنجیرەی مێژوو بۆ لاوان (١٠)

ناوی کتێب: جەنگی سارد

نووسەر: ئالاسدر نیکلسن

لە فارسییەوە: ئاگری ئەفشین

چاپ: ئەلکترۆنی

ساڵ: ٢٠١٧

**ناوەڕۆك:**




**جەنگی سارد لە ئەوروپا**

## پێشەکی:

هەموان دەزانن جەنگ چیە. ئەو کاتەی کە خەڵك لە گەڵ یەك دوژمنایەتی دەکەن بەم کارەیان دەوترێت جەنگ. بەڵام جەنگی سارد چیە؟ ئەمە ناوێکە دراوەتە پاڵ ئەو سەردەمەی مێژوو کە لە ساڵی ١٩٤٦ دەستی پێکرد و تا ساڵانی ١٩٦٠ و دواتریش هەر بەردەوامی هەبوو، لەو سەردەمەدا دوو لە بەهێزترین وڵاتەکانی جیهان دەستیان کردە دژایەتی کردنی یەکتری بەڵام بە ئاشکرا لە گەڵ یەك نەدەجەنگان. لەم کتێبەدا ئێمە لێکۆڵینەوە لە سێ بابەت دەکەین-مشتومڕیان لەسەر چی بوو" بۆچی بە ئاشکرا لە گەڵ یەك نەجەنگان" و دمبەدمەی ئەوان چ کاریگەریەکی لەسەر باقی وڵاتەکانی دیکە هەبوو.

ئەو دوو وڵاتە گەورەیە بریتی بوون لە یەکێتی سۆسیالیستی سۆڤیەت و ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، کە زۆربەی خەڵك پێیان دەڵێن ڕوسیا و ئەمریکا. هەر کام لەم دوو وڵاتەش هاوپەیمانی تایبەت بە خۆیان هەبوو. وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژهەڵات هاوپەیمانی ڕوسیا بوون و وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاواش پشتیوانی ئەمریکا بوون. زۆرجار بەم هاوپەیمانیتیە دەوترێت یەکێتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا. زۆربەی وڵاتانی جیهان هەوڵیان دا خۆیان بەدوور بگرن لەم دەرگیریە بەڵام بۆ هیچ وڵاتێك نەلوا کە بەتەواوی خۆی لە کاریگەریەکانی بپارێزێ. جەنگی سارد هۆکاری زۆری هەبوو بەڵام ئەگەر وا بڕیار بێت کە تەنها یەکێکیان هەڵبژێرین، دەتوانین بڵێن هۆکارەکەی "ترس" بوو. ڕوسیا لە ئەمریکا دەترسا و ئەمریکاش لە ڕوسیا دەترسا. ڕەوشی بەڕێوەبردنی وڵاتی ڕوسیە جیاواز بوو دەگەڵ ئەمریکا و هەر کام لەوان دەترسان کە ئەوی دی شێوازی ژیان لە وڵاتەکەی لەناوبەرێت. هەر کام لەوان باوەڕ و فیکری




هاوپەیمانانی ڕۆژئاوا و یەکێتی کۆماری ڕوسیا

جیاوازیان هەبوو لەمەڕ پێشکەوتنەکانی داهاتوی جیهان. ڕێبەرانی ڕوسیا کومونیست بوون" یانی باوەڕیان وە بوو کە پاش خەباتی چینایەتی ، دونیایەکی تازە دێتە بوون کە تێیدا هەموو مرۆیەکان یەکسان دەبن، هەموان لە موڵك ومالّ هاوبەش دەبن و هێز لە حکومەتی ناوەندی چرناکرێتەوە. لە هەمان حالّدا لە دەستپێکی شۆڕشی یەکێتی سۆڤیەتی سالّی ١٩١٧ سیستەمێکیان دروست کرد کە حکومەت چاوەدێری تەواوی هەبوو بە سەر ئیدارکردنی خەلّکەوە. ئەوان چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد کە سیستەمی کۆمونیستی پەرەبسێنێ و هەروەها کومونیستەکان ستایشی ئەو شۆڕشانەیان دەکرد کە لە ولّاتانی دیکە سەریانهەلّدەدا.

ڕێبەرانی ئەمریکا خۆشیان لە کومونیستی نەدەهات. هەوەلّ ئەوەی ئەوان پێیان وا نەبوو کە ئەم سیستەمە شتێکی بە سوود بێت لەبەرئەوەی بە بڕوای ئەوان لە سیستەمی سەرمایەداری(یان کێبرکی کردن لە سەرمایەداری) خۆیان، خەلّکەی خۆشگوزەرانترن.

دووهەم ئەوەی ئەوان وا بیریان دەکردەوە کە کومونیزم واتــە لەدەستدانی ئازادی" ئەوان ولّاتە کومونیستەکانیان وەکوو گرتووخانەی گەورە دەبینی کە پۆلیس فەرمانڕەوای بەسەر خەلّکەوە دەکات. هەروەها پێیان وابوو کە یەکێتی سۆڤیەت بەم پشتیوانی وستایش کردنەی بۆ شۆڕشەکان

دەیهەوێ هەموو ولّاتەکان قوت بدات. ئەمریکیەکان هەوڵ و تەقەلای زۆریان دا بۆ ئەوەی ڕێگر بن لەوەی ولّاتانی دیکە بنە سیستەمی کۆمونیستی. هەم ڕوسیە و هەم ئەمریکاش زلهێزانێك بوون کە چەکی پێشکەوتوو و مەترسیداریان هەبوو" لەبەرئەوە هەردولایان ترسیان لە هێرشی لایەکەی دیکە هەبوو.



کۆماندۆکانی حکومەتی یۆنان لە کاتی پشکنین لە جەنگی ناوخۆی یونان( لە ساڵی ١٩٤٦ تا ٤٩)کومونیستەکانی یونان چەندین جار هەوڵیان دا جڵەوی دەسەلاّت بگرنە دەست و بەلاّم ستالین نەیتوانی پارێزگاریان لیّ بکات.

## ئەوروپا لە ساڵی ١٩٤٥

لە جەنگی جیهانی دووەم ڕوسیا و ئەمریکا بۆ تێکشاندنی ئەڵمان لە ئەوروپا هاوکاری یەکدی بوون. بەلاّم بەر لە کۆتایی جەنگ ئەمریکا و ڕوسیە گومانیان لەسەر یەکتر هەبوو. ڕوسیا ئیتر نەیدەویست جارێکی دیکە ئەڵمان هێرش بکاتە سەر خاکەکەی وەکوو ساڵی ١٩٤١. لەبەر ئەم هۆکارە ڕوسیا بەر لەجەنگەکە بەشێکی لە ئەوروپای ڕوژهەلاّتی خستبووە ژێر دەسەلاّتی خۆی هەروەها سنورەکانی ڕۆژئاواشی بەرفراوانتر کردبوو. هەروەکو لە کاتی جەنگ، ڕوسیا ئەڵمانیەکانی وەلانا و ولاّتانی ڕۆژهەلاّتی ئەوروپای ڕزگار کرد، هەروەها لە ناوچەکانی خۆی چەندین حکومەتی سوسیالیستی دروست کرد. ئەو سنورەی کە لە نێوان ئەم ولاّتانە و ئەوروپای ڕۆژئاوا کێشرا پێی دەڵێن "پەردەی ئاسنین". (پەردەی ئاسنین دەستەواژەیەك بوو بۆ ئەو سنورەی کە لە ئەوروپا دروستکرابوو لە نێوان ڕۆژئاوای دیموکرات و ڕۆژهەلاّتی کومونیستی کە بۆ یەکەم جار ئەم دەستەواژەیە لە لایەن وینستۆن چێرچیل بە کار هات. و) ڕوسیەکان بۆ ئەوەی پارێزگاری لە سنورەکانی خۆیان بکەن لە باکوری ولاّت، دەیانویست هاوپەیمانی لە گەلّ هەموو ولاّتان لە تورکیەوە بگرە تا کۆریا ببەستن بۆ ئەوەی دڵنیا بن کە یەکێتی سۆڤیەت ولاّتێکی بەهێزە و هیچ هێزێك نەتوانێت لەو بەرەیەوە هێرش بکاتە سەریان. گەرچی ئەم خاڵە لە دیدی ڕوسەکانەوە لۆجیکانە بوو بەلاّم لە گەلّ بیری ئەوروپیەکان ناتەبا بوو، ڕوسیە دەیویست بەشێکی گەورە لە ئاسیا و ئەوروپا داگیر بکات، بەتایبەت سیستەمێکی حکومەتی سەپاندبوو بەسەر ڕۆژهەلاّتی ولاّتانی ئەوروپای ڕۆژهەلاّت کە خۆیان ویستیان لیّ نەبوو. ولاّتانی ئەوروپای ڕوژهەلاّت ترسیان لەم پێشڕەویەی ڕوسیا هەبوو و چاویان لە پشتیوانی وهاوکاری ئەمریکا بوو. لەبەر ئەم هۆکارە سوپای ئەمریکا لە ئەوروپای ڕۆژئاوا مایەوە. ئەمریکا دەوڵەمەندترین هێزی جیهانی بوو کە دەیتوانی چەك و سوپا دەستەبەر بکات بۆ



وێرانەکانی ڕایشتراگ. یان پەرلەمانی ئەڵمان لە بەرلین لە کۆتایەکانی جەنگی جیهانی دووەم. لە ساڵی ١٩٤٥ ئەڵمان شکستی خوارد. لە لایان یەکێتی سۆڤیەت، ئەمریکا، بەریتانیا و فەڕانسە داگیر کرا.

پشتیوانی کردن لە وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا و تەنها وڵات بوو کە بەهێزترین چەکی ئەو سەردەمەی هەبوو( چەکی ئەتۆمی). گەرچی ڕوسیا سەربازی زیاتری هەبوو بەڵام هیچ کات جورئەتی ئەوەی نەبوو هێرش بکات، چونکە دەیزانی ئەمریکا بە چەکی ئەتۆمی دەیتوانی هەموو شارەکانی ڕوسیا تەخت بکات. سەرۆك کۆماری ئەو کاتەی ئەمریکا، ترومن، پێی وابوو کە کومونیزم هێزی شەیتانیە کە ئازادی تاکە کەسی سەرکوت دەکات. ئەو بەڵێنی بە خەڵکی نەتەوە یەکگرتوەکان دابوو کە لە هەموو شوێنێك پشتیوانی لە "خەڵکی ئازادی" جیهان دەکات.

لە کۆتایی جەنگ، ئەوروپا ڕووبەڕوی کێشەی سەختی کۆمەڵایەتی و ئابووری بوویەوە. لە ئەوروپا، پیشەسازی، کیڵگە و ڕێگای شەمەندەفەر وێران بون و ملیۆنان کەس بونە پەناهەندەی بێ حاڵ ومالّ. (جۆرج مارشالّ) وەزیری دەروەی ئەمریکا پلانە بەناوبانگەکەی خۆی خستە ڕوو کە بە پێی ئەو پلانە دەبێ هەموو وڵاتەکان بەژدار بن لە هاوکاریەکانی ئەمریکا بۆ وڵاتانی دیکە تا ئەو کاتەی ڕێکبکەون لەسەر بونیادنانەوەی ئەوروپا. لەبەرئەوەی ئەم پێشنیارە بە سوودی ئینگلتەرا، فەڕانسە و زۆربەی وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا بوو، بە خێرای هەموویان پەسەندیان کرد. لە لایەکی دیکەوە ڕوسیا ئەم هەوڵەی ئەمریکای بە داگیرکردنی ئەوروپا دەبینی و ڕێگری دەکرد لەوەی هیچ وڵاتێکی کومونیستی شەریك بن لەم پێشنیارە.

## ئەڵمان

هۆکاری سەرەکی دمبەدمەی ڕوسیا و ئەمریکا لەسەر ئەڵمان بوو. ڕوسیا پێی وابوو ئەڵمان مەترسیەکی گەورەیە بۆ سەر ئاشتی و ئاسایشی جیهان. لە ڕاستیدا ئەڵمانی نازی بە ڕێبەرایەتی هیتلەر بوە هۆی تەشەنەی جەنگ و نابودی ئەوروپا. هێشتا لە دڵی ڕوسەکان زامەکانی ٢٠ ملیۆن شەهید لە هاونیشتیمانیان سارێژ نەبوو. ئەڵمان و بەرلینیان کردبووە چوار بەشەوە( ناوچەی ئینگلتەرا، ئەمریکا، فەڕانسە و ڕوسیا). لەبەرئەمە ئەڵمان دابەش کرابوو و تەواو لاواز دەهاتە بەر چاو بەڵام هێشتا ڕوسیەکان هەر گومانیان هەبوو.

ئەم ڕاستیەی کە ڕوسیا و ئەمریکا دژ بەیەك بوون بوە موشکیلە بۆ هەر چوار دەسەڵاتداری بەرلین. بەرلین کەوتبووە ناوەڕاستی بەشەکەی ژێر دەستی ڕوسیا و



هاری ترۆمن سەرۆك كۆماری ئەمریكا. ئەو كاتەی لە كۆنگرە بیرۆكە بە ناوبانگەكەی خۆی خستە ڕوو و گوتی: بە بڕوای من سیاسەتی ئەمریكا دەبێ پشتیوانی لە ئازادی نەتەوەكانی جیهان بكات كە لە بەرامبەر كەمینە چەكدارەكان و فشارەكانی دەرەوە خۆڕاگری بكەن.

بەتەواوی دوور خرابووەوە لە بەشەكەی ڕۆژئاوای ئەڵمانی ژێر دەستی هاوپەیمانان. ئەوان دەیانەویست ناوچەكانی خۆیان لە بەرلین كۆنترۆڵ بكەن بەڵام ڕوسیا دەیەویست كە هەموو بەرلین لە بەشێكی ناوچەی ژێر دەستیان لە خاكی ئەڵمان بێت.

## گەمارۆی بەرلین

لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٨ یەكێتی سۆڤیەت بە بیانوی لەناوبردنی پشێویی دارایی، هەموو ڕێگاكانی وشكانی بۆ شاری بەرلین گەمارۆدا. هاوپەیمانانی ڕۆژئاوا بە هۆی ناردنی خۆراك لە ڕێگەی ئاسمانیەوە ئەم گەمارۆیەیان شكاند. سوود وەرگرتن لە هێزی سەربازی بۆ شكاندنی ئەم گەمارۆیە ڕەنگە جەنگێكی گەورەی دیكەی لە ئەوروپا لێكەوتبایەوە. بەڵام ڕۆژئاوایەكان لەو فكرەدابوون كە هەرچی زووە ئەگەر ڕێگە لەم هەڕەشەیەی ڕوسیا نەگرن ئاسایشی داهاتووی وڵاتانی ڕۆژئاوا دەكەوێتە مەترسیەوە. پێشتر لە هەمان ساڵ حكومەتێكی كومونیستی لە لایەن ڕوسیاوە پشتیوانی دەكرا و جڵەوی حكومەتی چێكسلۆڤكی گرتبویە دەست.

ڕۆژئاوای بەرلین نزیكەی یانزە مانگ پشتی بە ڕێگەی ئاسمانی بەستبوو كە هاوكاریان بۆ دەهاتە ناو شارەكەوە. فڕۆكەكان تەنها خۆراكیان دەگەیاندە شارەكە. خۆراكی خەڵكی بەرلین زۆر سادە بوو. پێكهاتبوو لە سەوزی وشك، شیری وشك، كامپوتی گۆشت و ڕێژەیەكی كەم شەكر و كەرە. سوتەمەنی جیرەبەندی كرابوو و كارەباش زۆر كەم بوو. بەهەرحاڵ، گواستنەوەی خۆراك لە ڕێگای ئاسمانی سەركەوتوو بوو و كاتێك كە یەكێتی سۆڤیەت لە ئایاری ١٩٤٩ دەستی لە گەمارۆ هەڵگرت.



**خەڵکی بەرلین لە کاتی تەماشا کردنی فڕۆکەیەکی ئەمریکی کە خۆراکی پێیە و دەبهەوێ گەمارۆکانی ڕوسیا بشکێنێ لە ساڵی ١٩٤٨.**

**زیاتر لە ٢،٠٠٠،٠٠٠ تۆن خۆراکیان بردبوویە بەرلین و هێزی ئاسمانی هاوپەیمانان زیاتر لە ٣٠٠،٠٠٠ سەفەری ئاسمانیان بۆ بەرلین ئەنجام دابوو.**

## ناتۆ یان پەیمانی ئەتڵەسی باکوور

**ڕۆژئاوا جارێك لە جەنگی سارد سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو، بێ ئەوەی هیچ شەڕێك ڕویدابێت. یەکێتی ئەوروپا لە ژێر باڵی ئەمریکا زیاتر لێکتر نزیك بونەوە. ئەمریکیەکان بونە ئەندام لە ڕێکخراوێکی هاوپەیمانی وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا (بەناوی یەیمانی ئەتڵەسی باکوور یان ناتۆ. ئیدارەی ناوەندی پەیمانی ناتۆ لە فەرانسە بوو( ئێستا بنکەی سەرەکی لە برۆکسێلە پایتەختی بەلجیکا).**

## جەنگی کۆریا

**ئەمریکیەکان دەستڕۆییان هەبوو بە سەر ناوچەکانی زەریایی هێمن. لە ساڵی ١٩٤٥ ئەمریکا بە تەنهایی ژاپۆنی شکست خواردووی داگیر کرد. لە ساڵی ١٩٤٩ بە هۆی دامەزراندی حکومەتێکی گەورەی کومونیستی لە چین لە لایان مائۆتسە تۆنگ، ئەمریکا ترسی هەبوو لە بەرفراوانبوونی کومونیزم لە ئاسیا. ڕوسیە، هاوپەیمانی چین بوو و هەروەها لە زەریایی هێمن هێزێکی باشی هەبوو و دەیویست چینیش بۆ خۆی هێزێکی گەورە بێت و ناوچەیەکی بەرفراوانتر بۆ خۆی دەستەبەر بکات. بەڵام ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا خۆی بە دوور گرت لەوەی بە ڕەسمی دان بە هێزی چین دابنێت و پشتیوانی لە نەتەوەگەرکان دەکرد کە شکستیان خواردبوو وە پاشەکشەیان کردبوو بۆ دورگەی تایوان(فورموز).**

**مشتومڕی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە ئاسیا لەسەر کۆریا گەیشتبووە لوتکە. لە کۆتایی جەنگ، واتە لە ساڵی ١٩٤٥، کۆریا کە بەشێك بوو لە ئیمپراتۆریەتی ژاپۆن دابەش کرابوو. بەشی باکوورەکەی یەکێتی سۆڤیەت و بەشی باشورەکەی ئەمریکا بەڕێوەیان دەبرد. لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٠ دوای چەندین ساڵ مشتومڕ لە نێوان ئەم دوو بەشە کە تازە سەربەخۆیان بەدەستهێنابوو کۆریای باکوور کە کۆمونیست بوو هێرشی بردە سەر کۆریای باشور و هەموو وڵاتەکەی داگیر کرد. ئەمریکا کە ترسی لێنیشتبوو بە هۆی داگیر کردنی کۆریای باشور لە لایەن کومونستیەکانەوە بۆیە داوای هاوکاری لە نەتەوە**




**جەنگی سارد لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا**

یەکگرتوەکان کرد. لە ماوەیەکی کورت هێزەکانی پانزە وڵات لە جەنگی دژ بە هێزەکانی کۆریایی باکوور یەکێتیەکیان پێکهێنا. ئەمە هەوەڵین جەنگی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بوو. گەرچی ڕوسیا و ئەمریکا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ نەچووبونەوە ناو جەنگەوە بەڵام سەربازە ئەمریکیەکان بەشێکی گەورەی سوپای نەتەوە یەکرتوەکانیان پێکهێنابوو. جەنگ بە تەواوی لە زەرەری کۆریای باکور بوو و هێزەکانی نەتەوەیەکگرتوەکان پێشڕەویان کرد تا سنوری چین. چین بە شێوەی ڕاستەوخۆ نەچوو بووە ناو جەنگەوە چونکە بە مەترسی دەبینی بۆ سەر ئاسایشی خۆی. تەنها هێزێکی خۆبەخش کە پێکهاتبوون لە ١٥٠،٠٠٠ سەرباز چوون بۆ پشتیوانی کۆریای باکوور. هێرشی چینیەکان ئەوەندە کاریگەر بوو کە فەرماندەی ئەمریکیەکانی ناو هێزەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان ترسی لێنیشت و هەڕەشەی بۆمبارانکردنی بارەگا سەربازیەکانی چینی کرد لە مەنچووری. خەریك بوو کار لەکار بترازێ و جەنگی جیهانی سێیەم سەرهەڵبدات و هەروەها خەریك بوو ڕوسیە و بۆمبی ئەتۆمیشی تێبکەوێت. بەڵام ئەو فەرماندە لە

کار دوورخرایەوە و لە ساڵی ١٩٥١ گفتوگۆی ئاشتیانە دەستی پێکرد. لە جەنگی ساردی ئاسیا ئەمریکیەکان توانین چەندین وڵات بکەنە دۆستی خۆیان و پارێزگاری لە ناوچەکە بکەن لەوەی کە ڕوو لە کومونیستی بکەن. بەم ڕێکخراوە دەوترێت پەیمانی یەکێتی باکووری ڕۆژئاوای ئاسیا یان (سیتۆ). ئەمریکیەکان دەگەڵ وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش هەر لەم بارەیەوە هاوپەیمانیەتیان بەست. ئامانجی سەرەکی ئەوە بوو کە لە چواردەورەی سنورەکانی باکوری ڕوسیا بنکەی سەربازی دروست بکەن و ڕێگربن لە بەرفراوانبوونی کومونیزم بۆ باشوور، هەروەها ئامانجیشیان پارێزگاری کردن بوو لە زەخیرەی نەفت کە وڵاتانی ڕۆژئاوا پێویستیان پێ بوو.



**سەربازە زەمینیەکانی ئەمریکا کە پێشڕەوی دەکەن بۆ گوندێك کە لە جەنگی کۆریا وێران ببوو. سەربازە ئەمریکیەکان زۆرینە بوون لە نەتەوە یەکگرتووەکان کە لە گەڵ چین و کۆریا دەجەنگان. ولەم جەنگەدا ئەمریکا زیانی زۆری بەر کەوت.**

## هاوسەنگی ئەتۆمی

**تا ساڵی ١٩٥٣ ڕوسیەکان نەك هەر زانیاریان لەسەر چەکی ئەتۆمی پەیدا کردبوو بەڵکو پێشبڕکێی دروستکردنی تازەترین چەکی ئەتۆمی لە گەڵ ئەمریکا دەکرد. ئەگەر هەرکامیان سوودیان لە چەکی ئەتۆمی وەرگرتبایە دەیانتوانی کۆتایی بە جەنگی کۆریا بێنن بەڵام وێرانکاری گەورەیان دەهێنایە بوون. پەیوەندیەکی نوێ لە نێوان ئەم دوو زلهێزە پێویست بوو بۆ ئەوەی بە دوور بن لە بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی. ڕوسیا و ئەمریکا پێداچوونەوەیان بۆ سیاسەتەکانی خۆیان کردەوە چونکە دەیانزانی کە دەبێ لە گەڵ یەك مەسڵەت بکەن.**

**ستالین، ڕێبەری یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٥٣ مرد. جێنشینی ئەو خرۆشچەف سیاسەتێکی میانڕەوی پەیڕەو دەکرد و دەیویست لە گەڵ ڕۆژئاوا دانوستان بکات.**

**خرۆشچەف دڵنیا بوو لەوەی کە دەست پێشخەری بۆ ئاشتەوایی نیشانی دەدات کە کام نیزام و سیستەم باشترە: سیستەمی دیموکراتی ڕۆژئاوا یان سیستەمی سۆسیالیستی یەکێتی سۆڤیەت. هەر دوو زلهێزەکە بڕیاریان دا لە گەڵ یەکتری پەیوەندی مرۆیی ببەستن. ڕۆژئاواش ڕووی خۆشی بۆ ئەم ڕەوشە دۆستانەی ڕوسیا نیشان دا. ئایزنهاوەر، سەرۆك کۆماری ئەو کاتەی ئەمریکا پێشنیاری کرد کە بۆ بەدەست هێنانی زانیاری لەبارەی شوێنی بنکە سەربازیەکان لە هەر دوو لای پەردەی ئاسنین ڕووپێویی بکەن بۆ ئەوەی ترسی سەرلهەدانی جەنگ کەمتر بێتەوە. بەڵام ڕوسیەکان ئەم پێشنیارەیان پەسەند نەکرد.**



**ژنێك كە چاو لە خانوە ڕوخاوەكەی دەكات لە پیۆنگیانگ پایتەختی كۆریای باكوور، كە بە هۆی هێرشی نەتەوە یەكرتوەكانەوە نابود ببوو. لە جەنگی ساڵەكانی نێوان ١٩٥٠-تا ١٩٥٣ ناوچەیەكی گەورەی لە كۆریا وێران كرا.**

## جەنگی سارد لە ساڵەكانی ١٩٥٥ تا ١٩٦٢

**بەداخەوە گەشبینی هەردوولا بە هۆی هەبوونی ڕێگریی ناكام مایەوە. هەوەڵین ڕێگری بریتی بوو لە پەیمانی وارسۆ. ڕوسیا بەم پەیمانە ویستی بەرامبەر ناتۆ بوەستێتەوە.**

**ئێستاكە ڕوسیا هەموو وڵاتانی كومونیستی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپای لە چواردەوری خۆی كۆكردبووەوە. هەڵبەت تەواو ئاسایی بوو كە ئەو وڵاتانە هاوپەیمانی لەو جۆرە دروست بكەن بەڵام كاتێك سوپای هەر دوو زلهێزەكە لە دەوری پەردەی ئاسنین نزیك دەبونەوە بارودۆخەكە خراپتر بوو. كاتێك كە هێزەكانی ڕۆژئاوا ڕێگەی چەكداربوونەوەی ڕۆژئاوای ئەڵمانیان دا و كردیانە ئەندام لە ناتۆ ئەم ئاڵۆزیە زیاتر بوو.**

**دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٥٦ چەندین شۆڕشی دژ بە ڕوسیا لە پۆڵەند و هەنگاریا ڕوویاندا. كاتێك زانیان شۆڕشەكەی هەنگاریا خەریكە سەركەوتوو دەبێ، خرۆشچێف دەستوری بە سوپاكەی خۆی دا كە دووبارە ئارامی وئاسایش بگەڕێننەوە بۆ هەنگاریا. وڵاتانی ڕۆژئاوا بە جۆرێك دەیانڕوانیە ئەم ڕوداوە كە ئەگەر ڕوسیا بە هێزێكی لەوجۆرە بیهەوێ وڵاتێكی بچوكی وەكوو هەنگاریا شكت پێ بێنێت ئیتر هومێدێكی لەوجۆرە نییە بۆ( ئاشتی و سەبرگرتن ) لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا.**

**هۆكارێكی دیكەی گومانەكان ئەوە بوو كە لە ساڵی ١٩٦٠ فڕۆكەكانی سیخوڕی ئەمریكا بە ئاسمانی ڕوسیا دەسوڕانەوە. ئەمریكیەكان نكۆڵیان لەوە كرد بەڵام ڕوسەكان یەكێك لە فڕۆكەكانیان خستە خوارەوە و فڕۆكەوانەكەیان دەستبەسەر كرد.**



جۆن فۆستر دالس وەزیری دەرەوەی ئەمریکا ١٩٥٠

## دیواری بەرلین

لە ساڵی ١٩٤٩ داگیر کردنی ئەڵمان کۆتایی پێـــهات بەڵام سەربازەکانی هەردوولا لە ئاڵمان مانەوە. ئەو ناوچانەی لە ژێر دەستی فەڕانسە، بەریتانیا ئەمریکا بوو سەرەنجام گۆڕدرا بۆ کۆماری فیدراڵی ئەڵمان یان ئەڵمانی ڕۆژئاوا" لە حاڵێکدا کە ناوچەکەی ژێر دەستی ڕوسیا ناوینرا کۆماری دیموکراتی ئاڵمان یان ئەڵمانی ڕۆژهەڵاتی کومونیستی. شاری بەرلین دابەش کرابووە سەر دوو بەش و کەوتبووە ناوەڕاستی ڕۆژهەڵاتی ئاڵمان. سنوری نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئاڵمان بە تەواوی لە ژێر چاوەدێریدا بوو بەڵام خەڵکی دەیانتوانی بە ئازادی لە نێوان ڕژهەڵات و ڕۆژئاوای بەرلین هاتوچۆ بکەن. لە ساڵانی ١٩٥٠ هەزاران نەفەر لە خەڵکی ئەڵمانی ڕۆژهەڵات هەڵاتن بۆ ناوچە ئاست بەرزەکان و دواتر کۆچیان کرد بۆ ئەڵمانی ڕۆژئاوا. زۆربەی ئەمانە کرێکاری کارزان بوون و پیشەوەر بوون و پیشەسازی ئەڵمان بە بێ ئەمانە بەرەو وەستان دەچوو. هەر لەبەر ئەمە لە ساڵی ١٩٦١ ئەڵمانی ڕۆژهەڵات دیوارێکی بەرزی لە ناوەڕاستی بەرلین دروست کرد و بە سەختی چاوەدێری دەکرد. هەندێك لە خەڵکی ئەڵمانی ڕۆژهەڵات کە دەیانهەویست بە سەردیوارەکە بپەڕنەوە بۆ بەری ڕۆژئاوای بەرلین دەکەوتنە بەر دەستڕێژی گولەی پاسەوانەکان. ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە خەڵکی ڕۆژئاوا وا بیر بکەنەوە کە سیستەمی کۆمونیستی خراپە.



نیکیتا خرۆشچف، سەرۆك وەزیری یەکێتی سۆڤیەت ئەو کاتەی ڕەخنە لە کۆمەڵەی گشتی ڕێکخراوی نێونەتەوەی دەگرێت لە ساڵی ١٩٦٠.

## قەیرانی کوبا

لە ساڵی ١٩٥٩ سوپای چریکی شۆڕگێڕێکی لاوی کوبایی کە ناوی فیدڵ کاسترۆ بوو، حکومەتی دیکتاتۆری ستەمکاری کوبای واتە (باتیستا) لە کوبا لە ناوبرد، کە دورگەیەکە لە دەریای کارائیب.

کاسترۆ زۆر دژ بە هێزی سەربازی و ئابووری ئەمریکا بوو لەو ڕوانگەوە کە ئەمریکا دەوڵەتەکانی ئەمریکای ناوەڕاستی خستبووە ژێر سوڵتەی خۆی و هەمیشە پشتیوانی (باتیستای) دەکرد. کاسترۆ کومونیست بوو و حکومەتە سوسیالیستە نوێیەکەی پەیوەندی هەمیشەی هەبوو لە گەڵ ڕوسیا. بۆ یەکەم جار ڕوسیا هاوپەیمانی لە ئەمریکای لاتین پەیا کردبوو کە تەنها ١٠٠میل لە نەتەوەیەکگرتووەکانی ئەمریکاوە دوور بوو.

ئەمریکیەکان بنکەی سەربازی گرنگیان لە کوبا هەبوو و دەیانهەویست دڵنیا بنەوە لەوەی ئەم بنکانە هیچ زیانیان بەرنەکەتووە. ناچار هانای بۆ ئەو کوبایانە برد کە دورخرابوونەوە بۆ ئەمریکا و لەوێ دەژیان، داوای لەوان دەکرد و پشتیوانیشی دەکردن بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر کوبا وکاسترۆ لە ناو بەرن. هەڵبەت ئەمریکیەکان لەم کارەیان تەواو دووچاری شکست بوونەوە بەڵام ئەم هێرشە ئەو دڵنیایەی بە کاسترۆ دا کە ئەگەر جارێکی دیکە لەم هێرشانە بکرێتە سەری دەبێ داوای یارمەتی لە ڕوسیە بکات. کوبایەکان داوای هاوکاری سەربازیان لە ڕوسیا کرد و لە ساڵی ١٩٦٢ چەکی قورس وموشەکەکانی ڕوسیا گەیشتنە کوبا. ئەگەر ئەم چەکانەی ڕوسیا لە کوبا جێگیرکرابان بەڕاستی ناتۆ دەکەوتە خەتەرەوە چونکە سیستەمی پارێزگاری ئەوان لە خاکی ئەمریکا شکستی



**دیواری بەرلین کە لە ساڵی ١٩٦١ مەسولەکانی ئەڵمای ڕۆژهەلات دروستیان کرد. ئەم دیوارە سەرەنجام جیابونەوەی ئاڵمانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای لێکەوتەوە.**

**دەهێنا. شارەزایانی بواری سەربازی پێویستیەکانیان بە وردی بەرڕەسی کرد. ئەگەر چەکە ناوەکیەکان لە خاکی کوبا جێگیر کرابان بەشێکی زۆر لە خاکی ئەمریکا نابود دەبوو.**

**جۆن ئێف کەنەدی بڕیاری دا (دابڕگەیەك بۆ هەموو ئەو چەکانە دروست بکات کە دەنێردرانە کوبا) هێزە دەریایی و ئاسمانیەکانی ئەمریکا ڕێگریان دەکرد لە هەرکەشتیەك کە گومانی ئەوەی لێکرابا کە موشکی پێیە بۆ کوبا. هەڵبەت ئەگەر ئەمریکیەکان ئەو کەشتیانەیان پشکنیبایە یان ڕێگریان کردبایە بچنە ناو کوباوە مەترسی ئەوەی هەبوو کە ڕوسیا ڕێگای توندتر بگرێتە بەر و لەوانەبوو ئەمریکا بۆمباران بکات. مەترسی ڕودانی جەنگێکی ئەتۆمی نزیك بوو. لە ٢٤ی تشرینی یەکەم، هەژدە کەشتی ڕوسی بەرەو کوبا بەرێکەوتن ئەو شوێنەی کە پاسەوانەکانی ئەمریکا لەوێدا جێگیر**

**کرابوون. ئێوارەی هەمان ڕۆژ هەموو کەشتیەکان بە ڕێی خۆیاندا گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەیان. خرۆشچف چاوپۆشی لە ڕوداوەکە کردوو و دونیا لە مەترسی ئەو جەنگە ڕزگاری بوو.**

**هەردوولا دەستیان کرد بە گفتگۆ کردن تا ئەم قەیرانە کۆتای پێ بێنن. لە کۆتایدا لە گەڵ یەك ڕێککەوتن. ڕوسیا ڕەزامەندی دەربڕی هەموو موشکەکانی بکێشێتەوە و بنکەکانی بێ چەك بکات. ئەمریکیەکانیش بڕیاریان دا گەمارۆی دەریای لەسەر کوبا لادەن و هێرش نەکەنە سەری.**

**کاریگەریەکانی قەیرانی کوبا زۆر گرینگ بوون. دوو زلهێز، واتە ڕوسیا و ئەمریکا، گەیشتنە ئەو ئەنجامە کە مشتومڕی لەو جۆرە هیچ کات نابێت ڕووبداتەوە چونکە دەرئەنجامی مەترسیداری دەبێت. لە ڕاستیدا بەهۆی زەروری بوونی ئەم بابەتە هەردوولا بە دوای چارەیەك بوون بۆ گەیشتن بە پێکەوەژیانی ئاشتیانە. بۆ دروستکردنی پەیوەندی باشتر لە نێوان خۆیاندا هێڵی تەلەفونیان لە نێوان واشینگتۆن و مۆسکۆ خستە کار.**



فیدل کاسترۆ کاتی ڕەخنەگرتن لە یەکێك لە وتارە دوورودرێژەکانی لە پاش بەدەست گرتنی دەسەڵاتی کوبا لە ساڵی ١٩٥٩. لە لای ڕاستی کاسترۆ، چێگڤارا شۆڕشگێڕی بەناوبانگ، دەبنرێت کە لە شۆڕشی کوبا هاوشانی کاسترۆ دەجەنگا. چێگڤارا سەرەنجام لە کاتی دەستپێکی جەنگی چریکی لە بۆلیڤی کوژرا.

## ڤێتنام

لە پاش کۆریا وڵاتێکی دیکە کە مشتومڕی نێوان چین و ئەمریکیەکانی لێکەوتەوە ڤێتنام بوو. ئەم وڵاتەش کە کەوتبووە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا کرابووە دووبەش، بەشی باکووری کومونیست و باشورەکەی غەیرە کومونیستی بوو. لە ساڵانی ١٩٦٠ جەنگێکی خوێناوی و درێژخایەن لەو ناوە ڕویدا و ئەمریکیەکان شکستیان هێنا لەوێ. بەشی گەورەی شەڕەکە شەڕی چریکی و لە دارستان و لادێکانی باشووری ڤێتنام بوو. کومونیستەکانی باکووری ڤێتنام پشتیوانی ئەم چریکانەیان دەکرد. ئەمریکیەکانیش پشتیوانیان لە باشووری ڤێتنام دەکرد و بە فڕۆکەش ئازۆقە جەنگیەکانی بۆمباران دەکرد. ئەم جەنگە چەندین ساڵی خایاند بەڵام هیچ کات سنورەکانی هیند و چینی نەبەزاند و هیچکات چین و ڕوسیاش ڕاستەوخۆ نەهاتنە ناو جەنگەکەوە. ئەمریکا تەنها بۆمبارانی دەکرد بەڵام باکووری ڤێتنامی داگیر نەکرد لەترسی ئەوەی جەنگەکە گەورە نەبێت و نەگاتە ئەو ئاستەی چین و ڕوسیاش تەداخولی جەنگەکە بکەن.

لەگەڵ ئەوەی ئەمریکا بە هەموو جۆرە چەکێك(بێجگە لە چەکی ئەتۆمی) هێرشی کردە سەر چریکەکان، بەڵان هێشتا نەیتوانی شکستیان پێ بهێنێ و یاخود ڕێگری بکات لە ناردنی هاوکاریەکانی باکووری ڤێتنام. سەرەنجام سەربازە ئەمریکیەکان لە پاش ڕاگەیاندنی ئاتەش بەست لە ساڵی ١٩٧٢ لە باکووری ڤێتنام چوونە دەرەوە. بەڵام جەنگ لە هیند و چین هەروا بەردەوامی هەبوو.

## پێکەوەژیانی ئاشتیانە

لە پاش قەیرانی کوبا هەندێك بابەت هاتنە پێشەوە کە هێزەکانی ڕۆژئاوا خۆیان لە بەرامبەر ڕوسیا بینیەوە بەڵام لەگەڵ هەموو ئەم ئاڵۆزیانە و جەنگی ڤێتنامیش، لەپاش ساڵی ١٩٦٣ پەیوەندیەکان باشتر بوون. هەڵبەت بۆ ئەم




**هەڕەشەی موشەکی کوبا لە ساڵی ١٩٦٢**

بابەتە بەڵگەی زۆر هەن. ڕێبەرانی ئەم وڵاتانە بە تەاوی لەوە بە ئاگا بوون کە کە کاریگەریەکانی چەکی ئەتۆمی چ دەرئەنجامێکی مەترسیداری دەبێت. سالأنێك بوو کە چەکی ناوەکیان تاقی دەکردەوە و ئێستا دەترسان لەوەی ولاتانی دیکەش هەمان چەك دروست بکەن و لە ئەنجامدا ڕێژەی ڕادیۆئەکتیڤ لە هەوادا ڕوو لە زیادبوون دەکات.

چەند مانگێك بەسەر قەیرانی کوبا تێپەڕیبوو، بەریتانیا، ئەمریکا و ڕوسیا ڕێکەوتن لەبارەی ڕاگرتنی تاقیکردنەوە ناوکیەکانی ناو دەریا و فەزا و ئەودیو فەزاش. ئەمە هەوەڵین هەنگاو بوو بۆ کۆنترۆڵ کردنی چەکی ناوەکی. (بگەڕێوە بۆکتێبی بۆمبی ئەتۆمی لەم زنجیرەیەدا) ڕوسیا ئیتر نەیدەتوانی پشت بە وەفاداری وڵاتانی هاوپەیمانە کومونیستەکانی ببەستێت. یـوگسلاڤیا هەوەڵین وڵات بوو کە لە ساڵی ١٩٤٨ خۆی بە دوور گرت لە ڕوسیا. ڕۆمانیا لە گەڵ هەبوونی کێشەی نێوان ڕوسیا و ڕۆژئاوا بەڵام دەرگای بۆ دانوستان کردەوە و دەرگای بە ڕووی گەشتیارەکانی ئەو وڵاتانەدا واڵا کرد. ئەلبانیاش ڕووی لە ڕوسیا وەرگێڕا. لە چکسلاوکیا حکومەتی نوێ سانسۆریان وەلاناو ئازادیەکی زیاتریان دا بە خەڵکەکەی. ڕۆسیا دەترسا کە چکسلاوکی لە پەیمانی وارسۆ بچێتە دەرەوە. ناچار جارێکی دیکە لە ساڵی ١٩٦٨ لە گەڵ هاوپەیمانەکانی هێرشی کردە سەر چکسلاوکی و وێرانیان کرد.



ئەم وێنەیە لە لایەن فڕۆکەیەکی ئەمریکایەوە گیراوە.
موشەکەکانی ڕوسیا لە سەر کەشتیەکانن و بەرەو کوبا دەڕوا.

بەڵام خولیای ژیانی ئازاد و خۆشبەختی زیاتر بۆ خەڵکی وڵاتانی کومونیستی ئەوروپای ڕۆژهەڵات هەر بەردەوامی هەبوو. لەبەرئەمە تا ساڵانی ١٩٧٠ یەکێتی سۆڤیەت چەندین گرێبەستی بازرگانی و پەیوەندی نزیکتری لە گەڵ وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژاوا واژۆکرد، لەوانەش ئەڵمانی ڕۆژئاوا، چونکە ڕوسیا هەر لەسەرەتای جەنگی ساردەوە ترسی لەم وڵاتانە هەبوو.

لە ساڵی ١٩٦٣ چین و ڕوسیا لەسەر هاوکاریەکانی ڕوسیا بۆ چین مشتومڕیان بوو و هەروەها کێشەیان هەبوو لە سەر سنورە دووروودرێژەکەی نێوانیان. هەروەها لە بارەی چۆنیەتی دروست بوونی کومونیستەوە دمبەدمەیان بوو. لە ئەنجامدا ئیتر چین کەمتر پشتی بە ڕوسیا دەبەست و کەم کەم ڕێبەرایەتی هەندێك گروپی کومونیستی دەکرد کە دژ بە سیاسەتەکانی ڕوسیا بوون. چین پەیوەندی دۆستانەی لە گەڵ وڵاتانی ڕۆژئاوا بەست و بە ئەندامبوونی لە نەتەوەیەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٧٢ نەك هەر لە گەڵ وڵاتانی ئاسیا و ئەفریقا بەڵکو لە گەڵ ئەمریکاش خۆی گونجاند.

بە درێژای ساڵەکانی دوای جەنگی جیهانی دووهەم زۆرێك لە وڵاتانی ئاسیا و ئەفریقا کە موستەعمەرەی بەریتانیا، فەڕانسە و هۆڵەند( هەندێ وڵاتی دیکەش) بوون سەربەخۆیی خۆیان بەدەست هێنا. ڕێبەرانی ئەو وڵاتانە بۆ نموونە وەکو نەهرۆ لە هیندستان و نیکرۆمە لە غانا نەیاندەویست وڵاتەکانیان لەم جەنگی ساردە بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی زلهێزەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا.



**ئەم وێنەیە فڕۆکەکانی ئەمریکای نیشان دەدا کە خەریکن بە مادەی کیمیایی داراستانەکانی باشوری ڤێتنام کە کومنیستەکان لەوێدا بوو وێران دەکات.**

**بەڵکو دەیانەویست بێ لایەن بمێننەوە و جیهانی سێیەم دروست بکەن. هەروەکو ئەم وڵاتانە سەربەخۆیان بەدەست هێنا هەروەها بوونە ئەندامیش لە نەتەوە یەکگرتوەکان و مافی دەنگدانیان وەرگرت و ئیتر پێویست نەبوو لایەنگری ئەمریکا یان ڕوسیا بن. کاتێك ئەم ڕێکخراوە لە ساڵی ١٩٤٥ بونیادنرا ڕوسیا و ئەمریکا و شوێنکەوتوانیان بەشداریان تێدا کرد. لە ساڵی ١٩٧٠ نەتەوە یەکگرتوەکان نزیکەی ١٥٠ ئەندامی هەبوو و هەموو وڵاتە نوێیەکانی ئاسیا و ئەفریقا لەم ڕێکخراوە دابوون. کاتێك لە ساڵی ١٩٧٢ وڵاتی چینی کومونیستی هاتە ناو ئەم ڕێکخراوەوە فەڕانسە حاڵەتی دژە ئەمریکای گرتبووە خۆی، ئیتر ئەم لێکجودایەی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا وەك پێشتر بەرچاو نەبوو.**

**زۆرێك لە ئەورووپیەکان لەسەر ئەو باوەڕ بوون کە ئەوڕپاش وەکوو جیهانی سێیەم لە نێوان ڕوسیا و ئەمریکا ڕەفتار بکات و زیاتر ڕۆڵی ئابووری بگێڕێ و زۆرێك لە وڵاتانی ئەوروپا لە گەڵ یەکتر ڕێکەوتن. لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٦٠ فەڕانسە بڕیاریدا لە ناتۆ بێتە دەرەوە و لە جیاتی**

**ئەوە شوێنی نەتەوەیەکگرتوەکان بکەوێت و بە سەربەخۆیی بڕیاربدات. (هەڵبەت فەڕانسە لە ساڵی ١٩٦٦ ویستی هێزێکی سەربازی سەربەخۆی هەبێت بۆیە لە ناتۆ خۆی کێشایەوە بەڵان لە ساڵی ٢٠٠٩ بە شێوەی تەواو هاتەوە ناو ناتۆ. و.)**



**تانکی ڕوسیا لە کاتی داگیر کردنی پراگ لە ١٩٦٨، خەڵك توڕەی خۆیان نیشان دەدەن.**

## جەنگی سارد لە مێژووی جیهان

**جەنگی سارد سەردەمێکی تاڵ، ئاڵۆز و پڕ دەردەسەری بوو. لە کۆریا و ڤێتنام مەرگ و نابودی و بە شێوەی جەنگی ڕاستەقینە سەریهەڵدا. لە ئاڵمان و بەشەکانی دیکەی جیهان جەنگی سارد خێزان و نەتەوەکانی لێك جیادەکردەوە. هەتا لە نێوان حکومەتە زلهێزەکانیشدا هەندێك دەستە و گروپ هەبوون کە هاوڕا نەبوون لە گەڵ حکومەتەکانی خۆیان و بێزار بوون لەو سیاسەتەی گرتبویانە بەر. ئایا جەنگی سارد تەنها لایەنی ماندووکەری هەبوو؟ بینیمان کە چۆن لە ساڵی ١٩٤٥ دوو زلهێزەکە ترسیان لێ نیشتبوو و لێك تۆقیبوون. ترسی ئەوان لە یەکتری ڕاستەقینە بوو و گومانەکان نەدەڕەوینەوە. هەردوولا دەبوایە دەرکی ئەوەیان کردبا کە لە داهاتوو بێ ئاگان" و جیهان بە شێوەیەك بەرفراوان دەبێت کە لە بیری ئەوان بە دوورە. کاتێك گەیشتنە ئەو دەرئەنجامە و تێگەیشتن کە کۆمەڵگاکانیان ئەوەندەش لە یەکتر جیاواز نین ئیدی مەیلی دەستدرێژی کردنە سەر یەکتریان نەبوو.**

**هەر لەو کاتەوە کە ئەم دوو زلهێزە دەرکی ئەوەیان کردبوو کە چەکەکانیان نەك هەر دژمن لە ناو دەبەن بەڵکو خۆیان وشارستانیەتی مرۆڤایەتیش لە ناودەبەن. بۆ خۆ پاراستن لە جەنگی جیهانی ناچار دەستیان کردە جەنگی سارد. گەرچی جەنگی سارد جەنگێکی ناخۆش بوو بەڵام زۆر لە جەنگی گەرم باشتر بوو.**

**کتێبە بڵاوکراوەکانی ئەم زنجیرەیە**




























